فەتوای زانایان دەربارەی

# مەولود

ئامادەکردنی

دەستەیەك لە زانایان

ربیع الاول: ١٤٣٦ / ٢٠١٥

بۆ بەدەستهێنان : ٠٧٥٠٤٥٦٥٦٣٥

**بسم الله الرحمن الرحيم**

قُلْ هَذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللّهِ وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ

**الحمد لله والصلاة السلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه . أما بعد :**

**هەموو ساڵێك لە مانگی ڕەبیعی یەكەم هەندێك قسە و باس دەربارەی مەولود دەكرێت و كۆمەڵێك ڕای جیاواز دەبیسترێت و بۆچونەكانیش وایان كردوە كە خەڵكی موسڵمان زیاتر بپرسێ و بە دوای وەڵامی ڕاست و دروستدا بگەڕێ، هەر بۆیە بە پێویستمان زانی كە لێكۆڵینەوەیەك دەربارەی فەتواكان بكەین و پاشان ڕای گەورە زانایان بخەینە بەر دەستتان بۆ ئەوەی بەرچاو ڕۆشن بن و وەڵامی ڕاستتان دەستكەوێت.**

لەبارەی یادی مەولودی پێغەمبەرمان محمد ( ﷺ ) بە گشتی دوو بۆچون هەیە :

١ / بۆچونی ئەو زانایانەی کە ئەم یادە بە بیدعەو حەرام دەزانن .

٢ / بۆچونی ئەو زانایانەی کە ئەم یادە بە چەند مەرجێك بە دروست دەزانن.

یەکەم : بۆچونی ئەو زانایانەی کە ئەم یادە بە بیدعەو حەرام دەزانن .

هەندێك لە زانایان پێیان وایە یادکردنەوەی مەولود بیدعەتەو حەرامەو یان بە لایەنی کەم ناپەسندە ( مکروە ).

ئەو زانایانەی کە ئەم بۆچونەیان هەیە ئەمانەی خوارەوەن :

١ / ئیبن و تیمیە ، لە کتێبی ( إقتضاء الصراط المستقیم )، هەرچەند لە بۆچونێکی دیکەدا بەمەرج رێگەی

پێداوه . ٢ / أبو حفص تاج الدين الفاكهانی ،له كتێبی ( بدعه ) كه تايبەت كراوه تەنها بەم باسه .

٣ / الشاطبي ، له كتێبی ( الإعتصام ) . ٤/ إبن الحاج المالكی ، له كتێبی ( المدخل ). ٥ / الشوكانی . ٦ / محمد عبدالسلام خضر الشقيری ، له كتێبی ، ( السنن و المبتدعات ) . ٧ / أبو طيب شمس الحق العظيم الآبادي . ٨ / بشيرالدين قنوجی ، له كتێبی ( غاية الكلام في أبطال عمل المولد و القيام ) . ٩ / أبو عبدالله محمد الحفار المالكی ، به كتێبی (المعيار المعرب ) . ١٠ / محمد ناصرالدين الألباني . ١١ / عبدالعزيز بن عبدالله بن باز . ١٢ / محمد بن صالح العثيمين .

بەڵگەکانیشیان بەکورتی ئەمانەن :

١ / دەڵێن یادی مەولود بیدعەتەو شیعەکان دایان ناوەو ئەهلی سونەش چاویان لێوە کردونەتەوە، لە کاتێکدا پێغەمبەر ( ﷺ ) دەفەرموێت ( من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد ) واتە ( هەر کەسێ شتێکی تازە بێنێتە ناو دینی ئێمە کە تێیدا نەبوبێت ، کارەکەی ڕەت ئەکرێتەوە ).

( .... و إياكم و محدثات الأمور، فإن كل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار ) واتە ( خۆتان بپارێزن لە زیادە هێنان بۆ ناو دین، چونکە هەموو زیادە کردنێك بیدعەتەو، هەموو بیدعەتێکیش گومرای یەو، هەموو گومرایەکیش بۆ دۆزەخە ).

وادەبینین ئەوانە کە یادی مەولود بە بیدعەت دادەنێن ، جیاوازی ناکەن لە نێوان بیدعەی زاراوەیی ( لغوى ) و بیدعەی ( إصطلاحي ) دەستەواژەیی، کە بیدعەتی زاراوەیی واتە هەموو شتێکی تازە هاتوو بۆ ناو دین جا

ئەم تازە هاتوە لەگەڵ دین بگونجێ یان نەگونجێ، لە کاتێکدا بیدعەی دەستەواژەیی ( إصطلاحي ) واتا : ئەو زیاد کراوانەی کە پێچەوانەی بنەماکانی دین بێت. ئەم یادی مەولودە دابونەریتێکی زیاد کراوی ناو کۆمەڵگای موسڵمانانە نەوەك زیادە لە دیندا.

٢ / دەڵێن ئیماندارانی پێشینە ( سلف الصالح ) ئەم یادەیان نەکردۆتەوە .

ئێمەش دەڵێین : راستە هاوەڵان و شوێن کەوتوان بەم شێوەیەی ئێستای ئێمە ئەم یادەیان نەکردۆتەوە ،ئەگەرچی کردەوەی هاوەڵان نابێتە سەرچاوەی بەڵگەی براوە ( قاطع ) بەڵام هەمیشە باسی ژیان ( سيرة ) و سونەتی ئەم پێغەمبەرەیان ( ﷺ ) بەرز راگرتوە لە دڵ و ماڵ و کۆڕو مەجلیسیان، ئەگەرچی ئێمە وەك ئەوان نین کە هەمیشە ئەم یادە بەرز راگرین، بەڵام بەلای کەم با ساڵی جارێك کۆڕێکی جوان و خجیلانە بۆ ئەم یادە

ببەستین ، بۆ بـاس کردنـی سـوننەت و ژیاننامـەی ئـەم پێغەمبەرە ( ﷺ ).

٣ / دەڵێن : پێغەمبەر ( ص ) لە ١٢ ی رەبیعـی یەکـەم لـە دایکبووەو هەر لە ١٢ ی رەبیعی یەکەمیش وەفاتی کـردوە ، بۆ نایکەن بە یادی ماتەمینی نەوەك خۆشی .

ئێمـەش دەڵـێین قورئـان فەرمویـەتی ( وَلاَ تَهِنُـوا وَلاَ تَحْزَنُـوا وَأَنـتُمُ الأَعْلَـوْنَ إِن كُنـتُم مُّـؤْمِنِينَ ) واتـە خۆتـان بەکەم مەزانن و دڵ تـەنگ مـەبن ئێـوە هەمیشـە بـەرزو سەرکەوتون ئەگەر ئیمانـداری راسـتەقینەبن ) کەواتـە ئەسڵ لە ژیانی ئیمانداردا دڵ خۆشیە نەوك خەمباری.

٤ / دەڵـێن : یـادی لـەدایکبوونی پێغەمبـەر ( ﷺ ) چاولێکەری کافرانە، چونکە ئەوان یـادی لـە دایکبـوونی عیسی ( ﷺ ) دەکەنەوە .

ئێمەش دەڵێین : ئەم یادە عورفـە و بەشـێکە لـە داب و نەریتی ناو کۆمەڵگای موسڵمان نەوەك دین، لە عورفیشدا

چاولێکەری بۆ شتە باشەکان دروستە، تەنها لە عەقیدە و شتە خراپەکان نابێت تەقلید بکەینەوە .

٥ / دەڵێن : ئەم یادە بۆیە حەرامە چونکە زیادە ڕۆیی دەکرێت لە مەدح و سەنای پێغەمبەر ( ﷺ ) بە جۆرێك کە لەبازنەی بەندایەتی خوا بەرز دەکرێتەوە بۆ پلەی خوایەتی کە خۆی( ﷺ ) قەدەغەی کردوە ( لا تطروني كما أطرت النصارى إبن مريم فإنما انا عبده فقولوا عبدالله ورسوله ) واتە ( زیادە ڕۆیی مەکەن لە بەرزکردنەوەی ناوی من وەك شوێن کەوتوانی عیسا کردیان ، بەڵکو من بەندەی خوام بڵێن بەندەو خواو پەیامبەری خوایە ).

ئێمەش دەڵێین : ئەمە ڕاستە ، وە ئێمەش دژی زیادەڕۆیین لە بەرزکردنەوەی زیاد لە پێویستی ناوی پێغەمبەر ( ﷺ ) بەجۆرێك وەك نەصارا بیکەین بە هاوەڵی خواو هانای بۆ ببەین ، بەڵام ئەمە نابێتە ڕێگر لەبەردەم یاد کردنەوەی ڕاست و دروستی بێ زیادە ڕۆیی ، کەوابوو با چاکسازی بکەین نەوەك نەهێشتنی ، چونکە

ئەم زیادە ڕۆییانە لە ناو نوێژو و حەج و ... هتد ، هەیە ئایا دەکرێ ئەم عیبادەتانە لابیەین بە بیانوی زیادە ڕۆیی یان چاکیان بکەین ؟

دووەم : بۆچونی ئەو زانایانەی کە ئەم یادە بەچەند مەرجێك بە دروست دەزانن .

دەڵێن ئەم یادی مەولودە کارێکی دروستە ( مباح ) ( چونکە بنچینەی هەموو شتێك دروستی یە ( مباح ) تا بەڵگەیەك دەیسەلمێنێت کە نا دروستە( حرام ) لە قورئان و فەرمودەشدا هیچ بەڵگەیەکی ڕاست و ڕاشکاو نی یە کە ڕێگری بکات لە یادکردنەوەی مەولودی پێغەمبەر( ص ) چونکە ئەم یادە هەروەك گوتمان داب و نەریتە نەوەك عیبادەت، داب و نەریتیش بە پێی نیازو ( نیەت ) شێوازی کردەوەکە حوکمی شەرعی وەردەگرێ، کە دروستە یان نادروستە ، کەواتە یادی مەولود ئەگەر بە نیازێکی چاك و شێوازێکی شەرعیانە ئەنجامبدرێت دروستەو پاداشتی لەسەر وەردەگرێت .

ئەو زانایانەی کە ئەم بۆ چونەیان هەیە .

١ / ابن الحجر الهيثمي

٢ / الحافظ محمد ابوبكر الشافعى

٣ / أبو شامه ، مامۆستای پێشەوا نەوەوی .

٤/ عبد الرحيم المصرى

٥ / الامام السنفاوى

٦ / على القارئ الهروى

٧ / ابن الجوزى

٨ / ابن الكثير

٩ / ابن تيميه

١٠ / الحافظ الشيبانى

١١ / ابن الحجر العسقلانى

١٢ / دكتور يوسف القرضاوي

١٣ / السيوطي

١٤ / موفتى العام لسلطنة عمان

١٥ / ابن الحاج

**١٦ / محمد متولى الشعراوى**

**١٧ / أحمد زينى دحلان**

**١٨ / حسنين محمد مخلوف**

**١٩ / الحافظ العراقى**

**٢٠ / عبدالكريم المدرس**

**٢١ / ابن عابدين**

**٢٢ / محمد الراتب النابلسى**

**٢٣ / ابن القيم**

**بەلگەی ئەو زانایانەی کە پێیان دروستە یادی مەولودی پێغەمبەر ( ﷺ ) بکرێتەوە.**

**١ / قورئان دەفەرموێت ( فَالَّذِينَ آمَنُواْ بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُواْ النُّورَ الَّذِيَ أُنزِلَ مَعَهُ أُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ) مامۆستا عبدالكريمی مودەریس دەفەرموێت ( وشەی ( عَزَّرُوهُ ) واتا بەرز راگرتنی ناوبانگی پێغەمبەر ( ﷺ ) ئەویش بەوە دەبێت سەڵاواتی بۆ بنێری سوننەتەکانی زیندوو**

بکەیتەوە و باسی ژیاننامەی بکەیت و خۆشی دەربـڕی لـە ڕۆژی لە دایکبوونی .

٢ / قورئـان دەفەرموێ ( وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ) دیسان مامۆستا عبدالکریمی مودەریس دەفەرموێت ( باسی سیرەت و خۆشی دەربڕینی ڕۆژی ولادەتی پێغەمبەر ( ﷺ ) تـەتبیقکردنی ئەم ئایەتەیە .

٣ / قورئـان دەفـەرموێت ( وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَى بِآيَاتِنَا أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَذَكِّرْهُمْ بِأَيَّامِ اللَّهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ) واتـا : یادی نیعمەتەکانی خوا بکەن و بەخششەکانی خوایان بیربێنـەوە یـەکێ لـە نیعمەتە هەرە گەورەکان هاتنە دونیای پێغەمبەرە ( ﷺ ).

٤ / قورئـان دەفەرموێت ( وَكُلاً نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ وَجَاءَكَ فِي هَذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ ) خـوای گـەورە پێغەمبـەرمان فێردەکـات یـادی پێغەمبـەرانی پـێش خـۆی بکاتـەوە بـۆ دامـەزراوی و ڕاستەڕێیونی لەسەر ئیمان وە بـەکردەوەش ئەنجامیـداوە

کاتێك دەچێتە مەدینە پرسیار دەكات لەبارەی هۆكاری بەڕۆژوبونی جولەكەكان لە عاشورا فەرمویان چونكە لەم ڕۆژەدا موسا سەركەوت بەسەر فیرعەون ئەویش فەرموی ئێمە نزیكترین بۆ موسا لە جولەكەكان ئێمەش بەڕۆژو دەبین ، بۆئێمەش پێویستە یادی پێغەمبەرمان بكەینەوە بۆ دامەزراو بونی خۆمان لەسەر ئیسلام.

٥ / لە ڕۆژی لەدایكبونی پێغەمبەر ( ﷺ ) كاتێك موژدەیان بە ابولەهەبی مامەیدا هەرزوو لەخۆشیان كەنیزەكێكی رزگار كرد لە پاداشتی ئەو خۆشی دەربڕینەی هەموو دوشەممەیەك خوای گەورە عەزابی لەسەر سوك دەكات لەكاتێكدا باوەڕی پێنەبوە ئەی بۆ كەسێك ئیمانی پێی هەبێت و خۆشی دەربڕێ بۆ یادی لەدایكبونی ؟!

٦ / سالی ٥٧١ی زاینی سالی لەدایكبونی پێغەمبەرە ( ﷺ ) كە دواتر ناونرا سالی فیل دواتر خوای گەورە یەكێ لە سورەتەكانی قورئانی ناونا الفیل بۆ ئەوەی بەهۆی ئەو سورەتەوە لەدایكبونی پێغەمبەرمان بیرنەچێتەوە،

٧ / پێغەمبەر ( ﷺ ) دەفەرموێت لەبارەی گەورەیی شەو و ڕۆژی هەینی یەکێ لە هۆکاری گەورەکردنی ئەو ڕۆژە هاتنە دونیای ئادەمە( ﷺ ) ، وە پرسیاریان لێکردوە لەبارەی گەورەیی ڕۆژی دوشەممە و ڕۆژوگرتن تێیدا فەرمویەتی جونکە من لەو ڕۆژەدا لەدایکبوم.

لە کۆتاییدا :

پێویستە بزانین کە خۆشی دەربڕینیش بۆ یادی مەولود مەرجی هەیە کە ئەمانەن :

١ / نیەت لە هەموو ئەو کارە باشانەی کە لەیادی مەولود دا ئەنجامدەدرێت مەبەست تەنها ڕەزامەندی خوا بێت نەوەك شتی تر.

٢ / زیادەڕۆیی لە مەدحی پێغەمبەردا ( ﷺ ) نەکرێت لەبازنەی بەندایەتی گەورەتر نەکرێت و هاواری بۆ نەکرێت ،بەتاییەت لە وتار و سرودەکاندا.

٣/ ئیسراف له خۆراك بەخشیندا نەكرێت ، بەڵكو با لەڕۆژی مەولوددا بەو پارەیە ئاواتی پێغەمبەر (ﷺ) بهێنینەدی كە هاوكاری هەژارن و بێ باوكان و بڵاوكردنەوەی زانستە.

٤ / پێویستە بزانین زیندوكردنەوەی یەك سوننەت و گوێڕایەلیكردنی پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمایشتەكانی باشترە لە هەزار مەولودی بێ دەستگرتن بە خوڕەوشتی ئەو نازدارە (ﷺ).

٥/ لە كۆڕو مەجلیسەكانی یادی مەولود تەنها باس لە ژیانی خۆشەویست بكرێت و پەیمانی پابەندبوون بە ڕەوشتە جوانەكانی دوپات بكرێتەوە ، كە خوای گەورە خۆشویستنی خۆی و لێخۆشبونی بە شوێنكەوتنی ئەو بەستاوەتەوە.